# الفاتحة

سورەتی الفاتحة بە تەفسیری سەلەف
لە تەفسیری إبن جریر الطبري

وەرگێڕان و ئامادەکردنی :
دوو خوشکی أهل السنة

سورەتی الفاتحة بە تەفسیری سەلەف لە تەفسیری ابن جریر الطبري

١- تەفسیری { بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ } = بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

- ابن عباس دەفەرمووێت : یەکەم شت کە جبریل دایبەزاند بۆ محمد ئەوە بوو کە پێی ووت : ئەی محمد پەنا بگرە بە السمیع العلیم ( دوو ناوی الله تعالی )ـــن لە شەیتانی دەرکراو ، پاشان پێی ووت بڵێ : { بسم الله الرحمن الرحیم } پاشان پێی ووت بەناوی الله ئەی محمد .

- ابن عباس لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت : بخوێنە بە زیکرو یادکردنی پەروەردگارت ، هەڵسەو دانیشە بەیادکردنی پەروەردگارت.

- العرزمي دەربارەی "الرحمن الرحیم" دەڵێت: "الرحمن" مانای ڕەحمەتە بۆ هەموو دروستکراوەکان، " الرحیم " بەڕەحمە بۆ ئیماندارەکان.

٢- تەفسیری وتەی الله { ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ } = سوپاس بۆ الله

- ابن عباس دەڵێت: جبریل بە (محمد)ـی فەرموو : ئەی محمد بڵێ: الحمدلله.

- ابن عباس دەڵێت : الحمدلله واتە سوپاس بۆ الله ، قبوڵکردن و ملکەچ بوون بۆ الله ، داننان بە نیعمەتەکانی و هیدایەتی و جگە لەوەش.

- **كعب** دەڵێ : ئەمە ستایشکردنی (الله) ـیە .

❖ تەفسیری { ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ } = سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

- **ابن عباس** دەفەرمووێ : جبريل بە محمد ـی وت : ئەی محمد بڵێ ( ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ) ،هەروەها جبريل وتی : ئەی محمد بڵێ : سوپاس بۆ ئەو الله ـیەی کە دروستکردن هەر هی ئەوە ، هەموو ئاسمانەکان بەوانەشەوە کە تیایاندایە ، هەموو زەوییەکان بەوانەشەوە کە تیایاندایە ، وە ئەوەی کە لەنێوانیاندایە ئەوەی کە زانراوە و نەزانراوە ، هەروەها وتی (واتە جبريل) : ئەی محمد بزانە کە پەروەردگارت لەهیچ شتێک ناچێت.

❖ تەفسیری { رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ } = پەروەردگاری جیهانیان.

- **ابن عباس** و **سعيد بن جبير** و **مجاهد** دەفەرموون : پەروەردگاری جن و ئینس.

٣ - تەفسیری { ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ } = بەخشندەی میهرەبان

ابن عباس لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێ :
[ الرحمن الرحيم ] واتە نەرموونیان و بەسۆزە الله تعالى بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان خۆشە ڕەحمیان پێ بکرێت ، وە دوورە ئەو ڕەحمەتە لەو کەسانەی کەوا پێیان خۆشنیە ڕەحمیان پێ بکرێت و ڕقیان لەو ڕەحمەتەی الله تعالى ـیە . بەهەمان شێوە هەموو ناوەکانی الله تعالى (واتە مەبەستی ئەوەیە والله اعلم الله تعالى یەکێک لە ناوەکانی الرحمن و الرحيم مە، هەرکەسێک ڕەحمەتی الله تعالى ـی خۆش بووێت ئەوا الله تعالى ڕەحمی پێدەکات، هەرکەسێکیش ڕقی لێبێتەوە ئەوە الله تعالى ڕەحمەتی خۆی لێ بەدووردەکات).

٤- تەفسیری { مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ } = خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت.

- **ابن عباس** دەفەرمووێ : هیچ کەس دەسەلاّتی نییه لەگەڵ ئەودا ( الله ) لەو ڕۆژەدا حوکمبکات، وەک ئەوەی لەدونیا هەیانه، پاشان فەرمووی: ﴿لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾، وه فەرمووی: ﴿وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾، وه فەرمووی: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ﴾.

❖ تەفسیری { يَوۡمِ ٱلدِّينِ } = ڕۆژی سزاو پاداشت ( قیامەت )

- **ابن عباس** دەفەرمووێ : ڕۆژی لێپرسینەوەیه له بەندەکان ، ئەوه ڕۆژی قیامەته، حسابیان لەگەڵدا دەکات به کردەوەکانی خۆیان ، پاداشتی چاکه بەچاکه و خراپەش به خراپه ، تەنها کەسێک نەبێ که لێی خۆشبێت ، بڕیار و فرمان هەر هی خۆیەتی پاشان فەرمووی: ( أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ).

- **ابن مسعود** ڕیوایەت دەکات له بەشێک له هاوەڵانی رسول الله که دەفەرموون : بریتیه له ڕۆژی حساب ( قیامەت ).

- **قتادة** دەڵێت : ئەو ڕۆژەیه که ( الله ) حساب لەگەڵ بەندەکانی دەکات لەسەر کردەوەکانی خۆیان.

٥ - تەفسیری { إِيَّاكَ نَعْبُدُ } = بەتەنها تۆ دەپەرستین

- ابن عباس دەفەرمووێ : جبریل بە محمدی ووت : ئەی محمد بڵێ خودایە تۆ بەتاک دادەنێین و لەتۆ دەترسین و داواش هەر لەتۆ دەکەین ئەی پەروەردگارمان جگە لەتۆ کەسی تر نا.

❖ -تەفسیری { وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ } = وە تەنها داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین

- ابن عباس لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێ : خودایە داوای یارمەتی لەتۆ دەکەین لە گوێڕایەڵی و عیبادەت بۆ کردنت و لەهەموو کارێکماندا.

٦- تەفسیری { ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ } = ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست

- ابن عباس لەتەفسیری ئایەتەکەدا دەفەرمووێ : ڕێگەی ڕاست و هیدایەت بخە دڵمانەوە و فێرمان بکە.

- هەروەها ابن عباس دەفەرمووێ : ئەوە ئیسلامە ، ئەوە دینی (الله)ـیە کە هیچ لارییەکی تێدا نییە.

- جابر لە تەفسیری ئایەتەکەدا دەفەرمووێت : ئەوە ئیسلامە ، کە فراوانترە لەنێوانی ئاسمان و زەوی.

- ابن مسعود لە بەشێک لە هاوەڵان ڕیوایەت دەکات کە دەربارەی ئایەتەکە دەفەرموون : ئەوە ئیسلامە.

- عبدالرحمن بن زید بن اسلم دەڵێت : ئەوە ئیسلامە.

- أبي العالية دەڵێت : ئەوە رسول الله و پاشان هاوەڵانیەتی ابوبکر و عمر ( واتە ڕێبازی ئەوان والله اعلم).

❖ تەفسیری { ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ } = ڕێگای ڕاست

- علي بن أبي طالب دەفەرمووێت : ڕێگەی ڕاست کتێبی الله ـیە.
- عبدالله دەفەرمووێت : ڕێگەی ڕاست کتێبی الله ـیە.

❖ تەفسیری { صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ } = ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون.

- ابن عباس لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێت : ڕێگەی ئەوانەی چاکەت لەگەڵ کردوون لە مەلائیکە و پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و صالیحان ، ئەوانەی گوێڕایەڵیت دەکەن و تۆ دەپەرستن.
- ابن عباس لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت : ئیمانداران.
- ربيع لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێت : پێغەمبەران.
- وكيع دەفەرمووێت : موسڵمانان.
- عبدالرحمن بن زيد دەفەرمووێت : پێغەمبەر و ئەوانەی لەگەڵیدان.

❖ تەفسیری { غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ } = نەک ڕێی ئەوانەی خەشمی تۆیان لیٚ گیراوە

- ابن عباس دەفەرمووێت : ئەوانەی خەشم و تورەیی الله ـیان لیٚ گیراوە بریتین لە یەهود ( جولەکە ).

- ابن عباس و عبدالرحمن بن زيد و باوكی و مجاهد و ربيع لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموون : یەهود

- ابن مسعود ڕیوایەت دەکات لە بەشێک لە هاوەڵان کە دەفەرموون : یەهود.

❖ تەفسیری { وَلَا ٱلضَّآلِّينَ } = نەک ڕێی ئەوانەی گومڕابوون.

- ابن عباس و عبدالرحمن بن زيد و باوكی و مجاهد و ربيع لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموون : ئەوانە نەصاران (گاورەکان).

- ابن مسعود ڕیوایەت دەکات لە بەشێک لە هاوەڵان کە دەبارەی دەفەرموون : نەصارا.

